# چۆنیەتی ئاشنابوون

# بە نوێژە سونەتەکان

ئامادەکردنی

**حاجی ابراهیم مولود خضر**

هەولێر/٢٠١٩

# فەرهەنگی بابەتەکان

## ( نوێژە ڕەواتبەکان ( صلاة سنن الرواتب )

١- بريتيه له (١٠) ڕکەعەت :

عن إبن عمر ( رضـي الله عنه ) قال صـليت مع النبي ( ﷺ ) ركعتين قبل الظهر، وركعتين بعدها ، وركعتين بعد المغرب ، وركعتين بعد العشاء ) ( رواه البخاري ) وفي رواية أخرى ، عن إبن عمر ( وحدثتني أختي حفصة : أن النبيَ ( ﷺ ) كان يصلى ركعتين خفيفتين بعد مايطلع الفجر ) ( رواه البخاري )

واتا : ئەم نوێژە سونەتانە لەدوای بانگ دان لە پێش و دوای نوێژە فەڕزەکان ئە نجام دەدرێت ، ئەم نوێژە سونەتانە دەبن به دوو بەشەوە : ( مؤكدة ) و ( غير مؤكدة )

١- مؤكدة : بريتيە لەو نوێژە سونەتانەی کەوا پێغەمبەری خودا( ﷺ ) لەسەریان بەردەوام بووە ،کە بريتيە لەو دوازدە ڕکەعەتەی لەم فەرموودەیە باسکراوە . ( "ما من عبد مسلم يصلي لله كل يوم اثنتي عشرة ركعة تطوعاً غير فريضة إلا بنى الله له بيت في الجنة أو إلا بني له بيت في الجنة" ، أربعَ ركعاتٍ قبلَ الظهر ، وركعتينِ بعدَ الظهر وركعتينِ بَعدَ المغرب ، وركعتينِ بَعدَ العشاءِ ، وركعتينِ قبلَ الفجر )

واتا: ( هیچ بەندەیەکی موسولمان نیە هەموو ڕۆژێك لە پێناو خودای گەورە دوانزدە ڕکاعەت نوێژی سوننەت بکات ئیلا خودای گەورە خانوویەکی لەبەهەشت بۆ دروست دەکات ) ئەم دوازدە ڕکەعەتە بەم شێوەیە دەکرێت : ( چوار ڕکەعە لە پێش نوێژی نیوەڕۆ و دوو ڕکەعەت لە دوای ، وە دوو ڕکەعەت لە دوای مغریب ، وە دوو ڕکەعەت لە دوای نوێژی عیشا وە .دوو ڕکەعەت لە پێش نوێژی بەیانی )

٢- غیر مؤکدة: بریتین لەو سوننەتانەی کەوا پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەندێ جار ئەنجامی داون وە هەندێك جار وازی لێ هێناون واتا لەسەریان بەردەوام نەبووە . ئەم نوێژانەش بریتین لە : ( دوو ڕکعەت لە پێش نوێژی عەسرو ، مغریب و ، عیشا ) بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە دەفەرمووێت : (بینَ کُلَّ أذانینِ صلاة، بینَ کُلَّ أذانینِ صلاة ) ثمَّ قالَ في الثالثةِ لِمَن شاءَ )

واتا: لەنێوان گشت بانگ و قامەتێك نوێژ هەیە . لەنێوان گشت بانگ و قامەتێك نوێژ هەیە . پاشان لەجاری سێیەم فەرمووی بۆ ئەوکەسەی کە بیەوێت ) .

## - فەزڵ و گەورەیی دوو ڕکەعەت سوننەت لە پێش نوێژی بەیانی:

سەبارەت بە فەزڵ وگەورەیی دوو ڕکەعەت سوننەت لە پێش نوێژی بەیانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێت :

( رَكَعَتا الفجرِ خيرٌ منَ الدنيا وَما فيها ) (رواه مسلم )

واتا : دوو ڕکەعەت سونەتی پێش نوێژی بەیانی خێرترو باشترە لە دونیاو گشت ئەو شتانەی تیایەتی فەزل و گەورەیی چوار ڕکەعەت نوێژی سونەت لە پێش و دوای نوێژی نیوەڕۆ

پێغەمبەری خودا( ﷺ ) فەرموویەتی :

(مَن حافَظَ على أربعِ ركعاتٍ قبلَ الظهر وَاربعِ بعدَها حرمَه الله على النار) (رواه أبوداود و الترمزي وقال حديث حسن)

واتە : هەرکەسێك پارێزگاری بکات لە سەر چوار ڕکەعەت نوێژی سونەت لە پێش و دوای نوێژی نیوەڕۆ خودای گەورە ئەم کەسە حەرام دەکات لەسەر ئاگر .

فەزل و گەورەیی چوار ڕکەعەت نوێژی سونەت لە پێش نوێژی عەسر پێغەمبەری خودا( ﷺ ) فەرموویەتی :

(رَحمَ اللة امرَءاً صَلى قَبلَ العصرِأربَعا ) ( رواه أبو داود والترمذي وصحيحه إبن حبان )

واتە : ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی چوار ڕکەعەت نوێژی سوننەت بکات لەپێش نوێژی عەسر ، بەلاّم نوێژ کردن لەو کاتەی خۆر ئاوا دەبێت .

باش نیە و مکروهە، بە بەلگەی ئەم فەرموودەیە : (لاتصلوا عند طلوع الشمس ولاعندغروبها ، فانها تطلع وتغرب على .....قرن شیطان) . (رواه بخاري و مسلم)

واتا : نوێژ مەکەن لەوکاتەی خۆر هەلّدێت و لەوکاتەی خۆر ئاوا دەبێت، چونکە لەسەر قۆچی شەیتانێك هەلّدێت و ئاوا دەبێت.

## - شەو نوێژ ( صلاة الليل ) :

واتە : ئەنجامدانی نوێژی سوننەت بەشەو کە پێی دەوترێت ( شەو نوێژ ) کاتەکەی لەدوای نوێژی عیشا دەست پێ دەکات تاوەکو پێش نوێژی بەیانی ، بەلاّم باشترین کاتی کۆتایی شەوە .

## -گەورەیی و فەزلی شەو نوێژ :-

سەبارەت بە گەورەیی و پاداشتی شەونوێژ پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی :

(أفضَل الصلاةِ بَعدَ الفَريضةِ صلاة الليلِ ) (رواه مسلم)

واتە : باشترین نوێژ لە دوای نوێژە فەرزەکان شەونوێژە .

ژمارەی ڕکەعەتەکانی شەونوێژ :-

هەندێك لە زانایان دەڵێن شەو نوێژ پێك هاتووە لە یازدە ڕکەعەت، بە بەڵگەی فەرموودەی دایکی ئیماندارا‌ن

( عائیشە ) ( ڕەزای خوای لێبێت ) کە دەفەرموێت : ( ما زاد رسول الله ﷺ ) في رمضان ولا في غير رمضان على احدى عشرة ركعة ) (متفق عليه )

واتە : پێغەمبەری خودا (ﷺ) نە لە ڕەمەزان وە نە لە غەیری ڕەمەزان لە یازدە ڕکەعەت زیاتری نەکردووە

وە هەندێك لە زانایان دەڵێن شەو نوێژ بە یازدە ڕکەعەت زیاتریش دروستە بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە :

( صلاة الليل مثنى فإذا خشي أحدكم الصبح صلى ركعة واحدة توتر له ما قد صلى )

واتە : شەو نوێژ دوو ڕکەعەت دوو رکەعەتە ، ئەگەر یەکێك لە ئێوە ترسا بانگی بەیانی بەسەردا بێت ، با یەك ڕکەعەت بکات نوێژە جووتەکانی بۆ دەکاتە ووتر . دەبینین لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ)

تەحدیدی ڕێژەی ژمارەی شەو نوێژی نەکردووە ، بۆیە دەڵێن مرۆڤ چەند ڕکەعەت بکات دروستە .

## نوێژی چێشتەنگاو : ( صلاة الضحى )

پێغـەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی ( يُصـبِحُ على كُلِّ سـلامى من أَحدكُم صـدقَةٌ : فكُلُّ تسـبيحة صـدقَةٌ، وكُلُّ تحميدة صـدقَةٌ، وكُلُّ تَهليلَة صـدقَةٌ، وكُلُّ تكبيرة صدقَةٌ، وأمرٌ بالمعروف صدقَةٌ، ونهيٌ عن المُنكر صدقَةٌ. ويُجزِيءُ من ذلك ركعتان يركعُهما من الضُحى )

واتا : هەربەیانیەك بەرامبەر هەرئەندامێك لەئەندامەکانی لاشەی یەکێك لە ئێوە سـەدەقەیەك ، ووتنی گشـت تەسـبیحاتێك وەکو ( سـبحان اللە ) سـەدەقەیە، وەگشـت سـتایشـێك بۆ خودا وەکو ( الحمدللە ) سەدەقەیە، وە ووتنی ( اللە أكبر )

سـەدەقەیە ، وەفەرمان کردن بە چاکە سەدەقەیە ، وە نهی کردن لە خراپە سەدەقەیە، ئەنجامدانی دوو رکەعەت لەکاتی چێشتەنگاودا جێگای گشت ئەم سەدەقانە دەگرێتەوە.

### -کاتی دەست پێکردنی نوێژی چێشتەنگاو :

کاتی دەسـت پێکردنی نوێژی چێشتەنگاو لەدوای بەرزبوونەوەی ڕۆژ بەئەندازەی ( ڕمحێك ) هەتاوەکو ڕۆژ بگات بە ناوەڕاستی ئاسمانەوە ، بەڵام باشترین و خێرترین کات ئەو کاتەیە کە ڕۆژ زۆر گەرم دەبێت )

- ***ژمارەی ڕکەعەتەکانی نوێژی چێشتەنگاو :***

نوێژی چێشتەنگاو بە دوو ڕکەعەت دەکرێت ، یان چوار ڕکەعەت ، یان شەش ، یان هەشت ڕکەعەت ، کەهەر یەکەیان بەڵگەی ( صحیح ) لەسەرە.

## ***نوێژی ئیستخارە ( صلاة الإستخارة )***

واتا نوێژی داواکردنی خێرو بەرەکەت و ڕێنموویی نیشاندانی باشترین ڕێگا لەخودای گەورە کاتێك مرۆڤ بیەوێ کارێك بکات ، ئەم نوێژە پێك هاتووە لە دوو ڕکەعەت ،لەدوای ئەنجامدانی نوێژەکە ئەم دوعایە دەکرێت کە لەم فەرموودەدا هاتووە. ( اللهم إني أستخيرك بعلمك، وأستقدرك بقدرتك وأسألك من فضلك العظيم، فإنك تعلم ولا أعلم، وتقدر ولا أقدر وأنت علام الغيوب، اللهم إن كنت تعلم أن هذا الأمر ( لێرە ناوی پێداویستیەکەی دێنێت ) خير لي في ديني ومعاشي وعاقبة أمري فيسّره لي ثم بارك لي فيه، وإن كنت تعلم أن هذا الأمر شرّ لي في ديني ومعاشي وعاقبة أمري فاصرفه عني واصرفني عنه، وقدّر لي الخير حيث كان ثم أرضني به ).

( رواه البخاري )

## ***نوێژی جەنازە ( صلاة الجنازة ):-***

واتە نوێژی مردوو ، ئەم نوێژە حوکمەکەی فەرزی کیفایەتە ، واتە ئەگەر هەندێك لە موسڵمانان ئەنجامی بدەن کیفایەتە و باقی

موسڵمانەکانی تر لەسەریان لا دەچێت ، کەواتە ئەگەر کەسێك مرد دەبێت هەندێك لە موسڵمانان نوێژی لەسەربکەن ئەگەر نا گشتیان تاوانبار دەبن . فەزڵ و گەورەیی نوێژی مردوو :-

پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی : ( مَن صلى على جنازة فلة قيراط ، ومن انتظرها حتى توضعَ في اللحد والقيراطان مثل الجبلين العظيمينِ ) واتە هەر کەسێك نوێژ لەسەر مردوویێك بکات بەئەندازەی چیایەکی گەورە پاداشتی بۆ هەیە ئەگەر لەگەڵیشی بی بۆناشتنی خێری بەئەندازەی دوو چیا هەیە.

## ***چۆنیەتی نوێژی مردوو :***

گشت نوێژێك لە نوێژەکان دەبێت بە دەست نوێژەوە بکرێت .

ئەم نوێژە بە پێوە ئەنجام دەدرێت ڕکوع و سجود و دانیشتن و تەحیاتی تێدا نیە .

پێکهاتووەلەچوارتەکبیر :-

أ : لە دوای تەکبیری یەکەم سورەتی ( فاتیحە ) دەخوێنرێت لەگەڵ سورەتێکی تر لە قورئان ،

ب : وە لەدوای تەکبیری دووەم ( صلوات ) لەسەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەم شێوەیە ( اللهم على محمد وعلى اله محمد كما صليت على إبراهيم وعلى أله إبراهيم وبارك محمد وعلى أله محمد كما باركت على إبراهيم وعلى اله إبراهيم فى العالمين إنك حميد المجيد )

ج : لەدوای تەکبیری سێیەم ئەم دوعایە بۆ مردووەکە دەکرێت : ( اللهم اغفر له، وارحمه وعافه، واعف عنه، وأكرم نزله، ووسع مدخله، واغسله بالماء والثلج والبرد، ونقه من الخطايا كما ينقى الثوب الأبيض من الدنس، وأبدله دارا خيرا من داره، وأهلا خيرا من أهله، وأدخله الجنة، وقه فتنة القبر وعذاب النار).ئەگەرپیاو بوو وە ئەگەر ژن بوو ( اللهم اغفر لها وارحمها )رواه مسلم.

د: وە لەدوای تەکبیری چوارەم ( دوعا ) بۆ مردووەکە و بۆ خۆیی و گشت موسڵمانان دەکات ، وە دەشتوانێت یەکسەر سەلام بداتەوە ، وە سەلام دانەوەی نوێژی مردوو وەکو سەلام دانەوەی باقی نوێژەکانی ترە، وە جائیزیشە تەنها یەك سەلام بەلای راست بدرێتەوە .

وە هەروەها جائیزە پێنج تەکبیر یان شەش تەکبیر یان حەوت تەکبیر یان نۆ تەکبیر بۆ نوێژی مردووبکرێت ، گشتی بەڵگەی ( صحيح ) ی لەسەرە .

## -نوێژی سوننەتی دەست نوێژ ( صلاه ركعتى وضوء ) :-

واتە دوو ڕکەعەت سونەت دوای دەست نوێژ هەڵگرتن ، ئەم نوێژە پێك هاتووە لە دوو ڕکەعەت ، پێغەمبەری خودا ( ﷺ ) ) دەفەرموێت ( من توضأ مثل وضوئي هذا، ثم صلى ركعتين لا يحدث فيهما نفسه، غفر له ما تقدم من ذنبه) .رواه مسلم

واتە : ( هەرکەسێك دەست نوێژ وەکو من هەڵبگرێت ، پاشان دوو ڕکەعەت نوێژ بکات ، نەفسی خۆی مەشغول نەکات بە هیچ شتێك ،

خودای پەروەردگار لەگشت تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێت ، وە هەروەها ئەم دوو رکەعەتە سونەتە لەدوای ئیحرام بەستن لەکاتی حەج و عومرەدا لە میقات ئەنجام بدرێت . وە دەبێت ئەم دوو رکەعەتە بەنیەتی سونەتی دەست نوێژ ئەنجام بدرێت نەك نوێژی ئیحرام بەستن .

## نوێژی سونەتەتی جەژنی رەمەزان و جەژنی قوربان صلاة العید )

ئەم دوو نوێژە بەلای بۆچوونی پێشینە واجبە ئەمە رای ابن و تیمیة و ابی حنیفة و غیر امان رایەکی امامی شافعی و یەکێکە لە دوو را لە مەزهەبی امامی احمد. هەردوو نوێژەکە دوو رکعاتە بەبێ بانگ و قامەت و بە گوتنی ( الصلاة الجامعة ) ئەنجام دەدرێت. لە رکعاتی یەکەمدا پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە حەوت تەکبیر دەگوترێت لە رکعاتی دووەمدا پێنج تەکبیر دەگوترێت . هیچ زکرێکی دیاری کراو نەهاتووە کەلە نێوان تەکبیرەکان بوترێت لەدوای نوێژەکە وتارێك دەخوێنرێتەوە ،سونەتە خۆ گۆرین و جلی نوێ لەبەر کردن و خۆبۆن خۆش کردن بۆ ئەنجامدانی نوێژەکە مەگەر سەرمای زۆر نەهێلێ لە مزگەوتدا ئەنجام بدرێت . گۆرینی رێگای چوون و گەرانەوە لە جەژنی رەمەزاندا سوونەتە .

## نوێژی تەوبەکردن ( صلاة التوبة )

واتە : نوێژی تەوبەکردن لە تاوان و گەرانەوە بۆ لای خودای پەروەرگار، ئەم نوێژە ئەم کاتە دەکرێت مرۆڤ تەوبە دەکات لەتاوان و پەشیمانی لەوەی کردوویەتی یان وتویەتی ، پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێت (ما من رجل يذنب ذنبًا، ثم يقوم فيتطهر، فيحسن الطهور، ثم يستغفر الله عزّ وجلّ إلا غفر له ) رواه الترمذي و إبن ماجة

واتا: هیچ پیاوێك نیە تاوانێك بكات ، پاشان هەڵبستێت دەست نوێژ بشوات ، پاشان نوێژ بكات ، پاشان داوای لێبووردن لە خودا بكات ئیلا خودای گەورە لێی خۆش دەبێت.

## -نوێژی باران بارین ( صلاة الإستسقاء )

واتا : نوێژی داواکردنی باران بارین لەخودای پەروەردگار کاتێك باران نەبارێت .

**-چۆنیەتی نوێژی باران بارین** : ئەم نوێژە وەکو نوێژی جەژن وایە، لەدەرەوەی شار دەکرێت ، دوو رکەعەتە لەرکەتی یەکەم حەوت تکبیر دەکرێت و لە رکەعەتی دووەم پێنج تکبیردەکرێت جگە لەدوو تکبیرەکانی چونە رکوع ،ئەم تکبیرانەش پێش خوێندنی سورەتی فاتیحایە و ئەم نوێژە بە جەماعەت دەکرێت ئیمام لە خوێندنی قورئان دەنگی هەڵدەبڕێت وە سوننەتە خەڵکەکە بە مل کەچی وە

خۆشکاندن بۆ خودای پەروەردگار بەردەوام شوێنی نوێژەکە بە زیکرو دوعا کردن بەرێ بکەون .

## -نوێژی مانگ گیران و خۆرگیران ( صلاة الكسوف والخسوف )

واتە نوێژی مانگ گیران و خۆر گیران ، ئەم نوێژە سوننەتی موئەکەدەیە ، پێش دەست پێکردنی بانگ و قامەتی بۆ ناکرێت بەڵام سونەتە بووترێت ( الصلاة جامعة ) .

نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران بە جەماعەت دەکرێت لە مزگەوت وە ئیمام بە دەنگ قورئان دەخوێنێت ، وە دوو نوێژە هەر یەکەیان پێك هاتوون لە دوو ڕکەعەت بەڵام هەر ڕکەعەتێك دوو ڕکوعی تێدایە ، وە دوو ڕاوەستانی تێدایە واتە لە یەك ڕکەعەت دا دوو جار فاتحەو قورئان دەخوێنرێتەوە ، وە دوو جار ڕکوعیش دەبردرێت. پاشان سوجدە دەبردرێت و ڕکەعەتی دووەمیش وەکو یەکەم دەکرێت، ئینجا سەلام دەدرێتەوە ، وە سوننەتە ئیمام لە دوای نوێژەکە ئامۆژگاری خەڵك بکات بە لە خوا ترسان و گەڕانەوە بۆ لای خوا .

## -نوێژی بوك و زاوا ( صلاة الزوجين معا في ليلة البناء )

واتە دوو ڕکەعەت سونەت نوێژی بوك و زاوا بەیەکەوە لەشەوی یەکەمی زاوایەتیدا ، ئەم سونەتە لە هاوەڵە بەڕێزەکان وارید

بووه، له ئهسـهرێکی سهحیحدا هاتووه .کۆمهڵێك له صحابه دهعوت دهكرێـت لـه لای زاوایـهك كـه نـاوی ابو سـعید بووه ئهم کۆمهڵه صـهحـابـه بـهڕێزانـه ( ڕهزای خوای گهورهیان لێبێت ) بهم زاوایه دهڵێـت : ( إذا دَخَلَ عَليكَ أهلُك فصَـلي ،ثمَ سَـلِ اللهَ مِن خيرِ مادخَلَ عليكَ ، ثمَ تَعوذُ به مِن شرِه )

واته ئهگهر خێزانت هاته لات دوو ڕکهعهت نوێژ بکه ، پاشان داوای خێرو بهرهکهت له خوای گهوره بکه لهوهی که هاتۆته لات ، وه پهنا بـه خوا بگره لـهشـهڕوو خراپهی . وه له ئهسـهرێکی تردا هاتوه پیـاوێك به ( عبدالله ) ی کوری مسـعود دهڵێت من ئافرهتێکی کچ و گهنجم هێناوه دهترسم لهگهڵم نهگونجێ و لێم توڕه بێت ، عبدالله پێی ووت ( إنَ الإلفَ مِن اللهِ والفركَ مِنَ الشيطانِ يُردُ أن يُكرهَ إليكُم ما أحَل اللهُ لَكُم ، فإذا أتتكَ فأمَرها أن تُصلي وراءك ركعتينِ ).

واتـه : بهیهکهوه ژیان و خۆشـهویسـتی لهلایهن خواوهیه و خوای گـهوره پێی ڕازییـه ، وه ناکۆکی و ڕق لێبونهوه له شـهیتانهوهیه ، شهیتان دهیهوێت ئهو شتهی خوای گهوره بۆ ئێوهی حهڵاڵ کردووه لای ئێوهش نـاخۆش و ڕق لێگیراو بکـات ، جا کاتێك خێزانهکهت هاته لات فرمانی پێ بکه با دوو ڕکهعهت نوێژ له دواتهوه بکات .

### - نوێژی دەرچـوون و هاتنەوە لە ماڵ ( صلاة الدخول والخروج من المنزل)

واتـا : نوێژی دەرچـوون و هاتنەوە لەماڵ ، سـوننەتە ئینسـانی موسـوڵمـان کـاتێك دەچـێتە ماڵوە دوو ڕکەعەت سـوننەت بکات وەکاتێك دەردەچێت لەماڵ سوننەتە دوو ڕکەعەت بکات .بەبەڵگەی ئـەم فـەرمووده صـحیحـه ( "إذا خرجت من منزلـك فصـلي ركعتين تمنعانـك من مخرج السـوء وإذا دخلت إلى منزلـك فصـلي ركعتين تمنعانك مدخل السوء." ) ( رواه البزاز وغيره وصحيحه الألباني )

واتـا : هەرکـاتێك ویسـتت دەربچیت لە ماڵەوە بۆ دەرەوە دوو ڕکەعەت نوێژی سـوننەت بکە ئەم دوو ڕکەعەتە سـوننەتە دەبێتە هۆکاری ڕێگری و پاراسـتنی تۆ لە دەرچـوونی خراپ و تووش بوون بەکاری خراپ ،وە هەکاتێك هاتیتەوە ماڵەوە دوو ڕکەعەت سـوننەت بکە، تۆ دەپارێزێت لە هاتنەژوورەوەی خراپ و تووش بەکاری خراپ.

### نوێژی گەڕانەوە لە سەفەر ( صلاة القادم من السفر)

واتـا :نوێژی ئەو کەسـەی لەسـەفەر دێتەوە سـونەتە بۆ ئەوکەسەی لـەسـەفـەر دێتـەوە پێش ئـەوەی بچـێتە ماڵەوە بچـێتەمزگەوت دووڕکەعەت نوێژی سـونەت بکات ئینجابچـێتە ماڵەوە،بەبەڵگەی ئەم فەرموودە صـەحیحە :عن كعب بن مالك( رضـى الله عنه ) قـال:

(وكان إذا قدم من سفر بدأ بالمسجد، فركع فيه ركعتين، ثم جلس للناس). (رواه أبي داود)

واتە پێغەمبەر (ﷺ) هەرکاتێك لە سەفەربگەرابوایەوە لە سەرەتادا دەچووە مزگەوت دوو ڕکەعەت نوێژی سونەتی تیادا دەکرد، پاشان دادەنیشت بۆ سەلام کردن و ئەحواڵ پرسین و چارەسەری کێشەی خەڵك .

## نوێژی ڕۆژی هەینی (صلاة سنة الجمعة مطلقا بلا تحديد)

واتا : نوێژی سوننەت لەڕۆژی هە ینیدا بەبێ تەحدید کردنی ژمارەی ڕکەعەتەکانی ، سونەتە بۆ ئەوکەسەی دەچێتە مزگەوت لەڕۆژی هەینیدا دەست بکات بە نوێژ کردن دوو ڕکەعەت هەتا ئەو کاتەی ئیمام ئەچێتە سەرمیمبە، بەڵام ئەم دوو ڕکەعەتەی کە ئێستا خەڵك دەیکات کە گشتیان بەیەکەوە هەڵدەستن لەدوای بانگی یەکەمی هەینی ، ئەم دوو ڕکەعەتە بەم شێوەیە بیدعەیەو دروست نیە چونکە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم شێوەیە نەکراوە ، لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەڕۆژی هەینی دا تەنها یەك بانگ دراوە ، لەدوای تەواوبوونی بانگەکە یەکسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتاری دەخوێندەوە و هاوەڵە بەڕێزەکانی گوێبیستی وتاری دەبون و هەڵنەدەستان بەیەکەوە ئەم دوو ڕکەعەتە نوێژە بکەن کە ئێستا زۆرێك لەخەڵکی دەیکات ، بەڵکو ئەوەی سوننەتە لەڕۆژی

هەینی دا بکرێت ئەنجامدانی نوێژی سوننەتە بەبێ تەحدید کردنی ژمارە بۆ رکەعەتەکانی هەتا ئەو کاتەی بانگ دەدرێت و ئیمام دەچێتە سەر میمبەر ، بەبەلگەی ئەم فەرمووده صەحیحە .قال رسول الله (ﷺ)

(مَن إغتَسَلَ يو الجمعة وَلَبِسَ مِن أحسَنِ ثيابهٖ وَمَسَّ مِن طيب إن كانَ عندهُ ثُمّ أتى الجمعة فَلَم يَتَخطَّ أعناقَ الناسِ ثُمّ صَلّي ما كَتَبَ اللهُ لَهُ ثُمّ أنصَتَ إذا خَرَجَ إمامَ حتى يَفرَغَ مِن صَلاتهِ كانَت كَفّارةً لِما بينها وَبينَ جُمُعَتهِ التي قبلها ) .

واتا : هەرکەسێك خۆی بشوات لەرۆژی هەینی دا ،وەجوانترین پۆشاك لەبەر بکات ، وە بۆنێکی خۆش لەخۆی بدات ئەگەر لای هەبوو، پاشان بەرێ بکەوێت بۆ مزگەوت .کاتێك گەیشتە مزگەوت قاچی بەسەرشان و ملی خەلکیدا پازنەدا، پاشان دەستی کرد بەنوێژکردن ئەوەندەی خودا لەسەری نوسیبوو ، پاشان بێدەنگ بوو کاتێك ئیمام چووە سەرمینبەر بۆ ووتار دان هەتاوەکو لەنوێژو ووتارەکەی تەواو دەبێت ،ئەم کەسە ئەگەر بەم شێوەیە ئاداب و عیبادەتەکانی رۆژی هەینی جێ بەجێ بکات ،خودای گەورە ئەم عیبادەتانەی بۆ دەکاتە کەفارەتی گشت ئەم تاوانە بچووکانەی کە لەنێوان رۆژەکانی ئەم هەینیەو هەینی رابردوو دا ئەنجامی داوە.

دەبینین پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم فەرموودەیەدا هانی موسولمانان دەدات بە ئەنجامدانی نوێژی سوننەت لە رۆژی هەینی دا بەبێ تەحدید کردنی ژمارە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی فەرموو لەدوای

بانگی هەینی هەمووتان بەیەکەوە هەڵبستن دوورکەعەت سوننەت بکەن .هەروەها لە ( عبداالله ) ی کوڕی عمر ( ڕەزای خودای لەسەربێت ) دا هاتووە کەوا لەڕۆژی هەینی دا دوازدە ڕکەعەتی کردووە. وە لە ( عبداالله ) ی کوڕی عباس ( ڕەزای خودای لەسەربێت ) دا هاتووە کەوا لەڕۆژی هەینی دا هەشت ڕکەعەتی کردووە. وە لە ( عبداالله ) ی کوڕی مسعود ( ڕەزای خودای لەسەربێت ) دا هاتووە کەوا لەڕۆژی هەینی دا چوار ڕکەعەتی کردووە. زانایان دەڵێن جیاوازی لەنێوان ژمارەی ڕکەعەتی ئم سێ صەحابە بەڕێزە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی ژمارەی دیاری کراوبەبەردەوامی لەڕۆژی هەینیدا لەمزگەوت کەواتەموسوڵمان بۆی هەیە بەگوێرەی توانای نوێژی سوننەت بکات لەڕۆژی هەینی دا، هەروەکو دەبینین ( إبن عمر ) دوازدە ڕکەعەتی کردووە ، ( إبن عباس ) هەشت ڕکەعەتی کردووە ، ( إبن مسعود ) چوار ڕکەعەتی کردووە. بەڵام تەنها ئەنجامدانی دوورکەعەت بەبەردەوامی لەڕۆژی هەینی دابیدعەیەو بەڵگەی صحیحی لەسەر نیە. هەورەوهالەدوای نوێژی هەینی داسوننەتە دوورکەعەت یان چوارڕکەعەت نوێژی سوننەت بکرێ بەبەڵگەی ئەم دوو فەرموودەیە.

١- قال رسول الله (( ﷺ ) ( مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مُصَلِّيًا يَوْمَ الْجُمُعَةِ ، فَلْيُصَلِّ بَعْدَهَا أَرْبَعًا) (صحيح مسلم)

واتا :ئەگەر یەکێك لەئێوە وویستی نوێژی سوننەت بکات لەدوای نوێژی هەینی دا با چوار ڕکەعەت بکات.

٢- یقول إبن عمر( رضي الله عنهما ) (حفظت من الرسول( ﷺ )... ... وثنتين بعد صلاة الجمعة في بيته )

واتا : عبدالله ی کوڕی عمر ( ڕەزای خودای لەسەربێت ) دەڵێت : وەرم گرتووە لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئە نجامدانی دوو ڕکەعەت سوننەتە لەدوای نوێژی هەینی لەماڵەوە.

## نوێژی مزگەوتی قباء ( الصلاة في مسجد قباء )

واتە : نوێژکردن لە مزگەوتی ( قباء ) لەشاری مەدینە ، سوننەتە بۆ ئەوکەسەی لەشاری مەدینەیە بچێت بۆ مزگەوتی ( قباء ) دوو ڕکەعەت نوێژی سونەتی تیابکات بەتایبەتی ڕۆژی شەممە ،( عبدالله ) ی کوڕی عمر( ڕەزای خوای گورەی لێبێت ) دەڵێت : (کان النبی ﷺ ): یاتی مسجد قباء کل سبت ما شیا و راکبا فیصلی فیة رکعتین ) واتە پێغەمبەری خوا( ﷺ ) دەچووە مزگەوتی ( قباء ) هەموو ڕۆژێکی شەممە بە پیادە یان بەسواری ، دوو ڕکەعەت نوێژی سونەتی تیا دەکرد . وە سەبارەت بە فەزڵ و گەورەیی نوێژی سوننەت لەم مزگەوتەدا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرموویەتی :

(من تطهر فی بیته ثم اتی مسجد قباء فصلی فیه کان له کأجر عمرة )

واتە : هەرکەسێك دەست نوێژ بگرێت لە ماڵەوەی پاشان بچێتە مزگەوتی ( قباء ) نوێژی سونەتی تیا بکات پاداشتی بۆ هەیە بە ئەندازەی پاداشتی عومرە .

## نوێژی مەقامی إبراهیم ( صلاة ركعتي الطواف خلف مقام إبراهيم )

واتە : دوو ڕکەعەت نوێژی تەواف لە پشت مەقامی ئیبراهیم ، سوننەتە بۆ ئەوکەسەی تەواف دەکات لەدوای تەواوبوونی تەوافەکەی بچێتە مەقامی ابراهیم دوو ڕکەعەت نوێژی سوننەت بکات ، وە هەندێك لەزانایان ئەم دوو ڕکەعەتەیان بە واجب داناوە ، خوای گەورە دەفەرموویێت : ( وَٱتَّخِذُوا مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى )

واتە : شوێنی جێگای لەسەر وەستانی پێغەمبەر ابراهیم ( سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێت ) بکەن بە جێگای نوێژکردن . کە بریتی یە لەئەنجامدانی دوو ڕکەعەت نوێژ لەدوای تەواوبوونی تەواف .

وە عەمری کوری دینار دەڵێت گوێم لە عبداللەی کوڕی عمر بوو ( ڕەزای خوای گەورەیان لێبێت ) دەیفەرموو : ( لَمَّا قَدِمَ رسولُ اللهِ ( ﷺ ) مَكَّةَ طافَ بالبَيتِ سَبعاً ثُمَّ صَلَّي خَلفَ المَقامِ رَكعتَين ) ( صحيح البخاري )

## نوێژە داهێنراوەکان :

### ١- نوێژی داواکردنی پێویست ( صلاة الحاجة )

واتـا : نویـژی داواکردنی پێویسـتی، ئـەم نویـژە لـەگـەڵ نوێژی ( إستخارة ) جیایە ،( صلاة الإستخارة ) دروستەو سوننەتە چونکە بەڵگەی صحیحی لەسەرە ، بەلام ( صلاة الحاجة ) دروست نیەو بیدعەیە چونکە بەڵگەی لاوازو هەڵبەستراوی لەسەرە وە کردەوە کردن بەبەڵگەی لاواز و هەڵبەستراو دروست نیە و بیدعەیە. ئەم فەرموودەیەی ( صلاة الحاجة ) لەسەر بنیاتنراوە فەرموودەیەکی ( موضوع ) ە واتە هەڵبەستراوە ئەمەش دەقی فەرموودەکە (من كانت لَهُ إلى اللَّهِ حاجةٌ أو إلى أحدٍ من بَني آدمَ فليتوضَّأ، فَليُحسِنِ الوضوءَ، ثمَّ ليصلِّ رَكْعتينِ، ثمَّ ليُثنِ على اللَّهِ عزَّ وجلَّ، وليصلِّ على النَّبيِّ ، ثمَّ ليقُل: لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ الحليمُ الكريمُ، سبحانَ اللَّهِ ربِّ العرشِ العظيمِ، الحمدُ للَّهِ ربِّ العالمينَ، أسألُكَ موجباتِ رحمتِكَ وعزائمَ مغفرتِكَ، والغَنيمةَ من كلِّ برٍّ، والسَّلامةَ من كلِّ إثمٍ، لا تدع لي ذنبًا إلَّا غفرتَهُ، ولا همًّا إلَّا فرَّجتَهُ، ولا حاجةً هيَ لَكَ رضًا إلَّا قضيتَها يا أرحمَ الرَّاحمينَ)

## ٢- شەو نوێژ لەنیوەی مانگی شعبان

واتە : هەستانەوە بۆ شەونوێژ عیبادەت لەشەوی نیوەی مانگی شەعبان ، تایبەتکردنی شەونوێژ و عیبادەت لەم شەوەدا دروست نیە و بیدعەیە چونکە بەڵگەی صەحیحی لەسەر نییە بەڵکو بەڵگەی زەعیفی لەسەرە ، وە کردەوەکردن بەبەڵگەی زەعیف هۆکارێکە بۆ بڵاوکردنەوەی بیدعە لەناو دینی ئیسلامدا ، ئەمەش دەقی فەرموودە زەعیفەکەیە کە ئەم بیدعەیەی لەسەر بنیات نراوە ، عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: " فَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ ، فَخَرَجْتُ ، فَإِذَا هُوَ بِالْبَقِيعِ رَافِعٌ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ ، فَقَالَ لِي: ( أَكُنْتِ تَخَافِينَ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْكِ وَرَسُولُهُ ؟ ) ، قَالَتْ: قُلْتُ : ظَنَنْتُ أَنَّكَ أَتَيْتَ بَعْضَ نِسَائِكَ ، فَقَالَ: ( إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَنْزِلُ لَيْلَةَ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيَغْفِرُ لِأَكْثَرَ مِنْ عَدَدِ شَعَرِ غَنَمِ كَلْبٍ) رواه أحمد (٢٦٠١٨) ، والترمذي (٧٣٦) ، وابن ماجه (١٣٨٩)

## ٣- دوو ڕکەعەت نوێژ لەدوای بانگی یەکەم لە ڕۆژی هەینیدا :

دوو ڕکەعەت نوێژ لەدوای بانگی یەکەم لەڕۆژی هەینی دا ، زۆرێک لەخەڵکی لەڕۆژی هەینی دا لەدوای بانگی یەکەمەوە هەڵدەستن تەنها ئەم دوو ڕکەعەت نوێژە دەکەن ، ئەم دوو ڕکەعەت نوێژە بەم

شێوەیە و بەم ژمارەیە دروست نیەو بیدعەیە هەروەکو لە پێشدا باسمان کرد .

### ٤-نوێژی بەدەست هێنانی پاداشتێکی زۆر :

سەبارەت بەم نوێژە بیدعەیە ئیمامی نەوەوی ( ڕەحمەتی خودای لێبێت ) دەڵێت "الصلاة المعروفة بصلاة الرغائب ,وهي ثنتا عشرة ركعة تصلى بين المغرب والعشاء ليلة أول جمعة في رجب وصلاة ليلة نصف شعبان مائة ركعةوهاتان الصلاتان بدعتان ومنكران قبيحتان ولايغتر بذكرهما في كتاب قوت القلوب ,وإحياء علوم الدين , ولا بالحديث المذكور فيهما فإن كل ذلك باطل ، ولا يغتر ببعض من اشتبه عليه حكمهما من الأئمة فصنف ورقات في استحبابهما فإنه غالط في ذلك , وقد صنف الشيخ الإمام أبو محمد عبد الرحمن بن إسماعيل المقدسي كتابا نفيسا في إبطالهما فأحسن فيه وأجاد رحمه الله "

**واتا : ئەو نوێژەی کە ناسراوە بە بەنوێژی ڕەغائیب ، کە پێکهاتووە لە دوازدە ڕکەعەت لەنێوان نوێژی مەغریب و عیشا ئە نجام دەدرێت لەشەوی یەکەم جومعەی مانگی ڕەجەب ، وە هەروەها نوێژی شەوی نیوەی شەعبان کە پێکهاتووە لە سەد ڕکەعەت ، ئەم دوو جۆرە نوێژە دوو بیدعەی خراپ و ناشرینن لە دیندا موسڵمان نابێت بەم دوو**

بیدعەیە هەڵبخەڵەتێت کەلە کتابی ( قوت القلوب ) و کتابی ( احیاء علوم الدین ) هاتووە ، وە بەم فەرموودەش هەڵمەخەڵەتێن کە باس لەم دوو بیدعەیە دەکات ، گشت ئەم شتانەی لەم دوو کێبەو حەدیسە هەڵبەستراوەکە هاتووە باتڵەو پووچ وبێ مانایە ، وە نابێت موسڵمان هەڵبخەڵەتێت ب هەندێك لەو پێشەوایانەی حوکمی ئەم دوو نوێژە بیدعەیان لێ تێکچووە کاتێك هەستاون بە نووسینی چەند وەرەقەیەك لەسەر بەسونەت دانانی ئەم دوو نوێژە ، ئەم جۆرە کەسانە لەم حوکمەیان بەهەڵە دا چوون ، ئیمامی ابو محمدی عبدالرحمن ی مەقدسی کتێبێکی زۆر بەسودی نووسیوە سەبارەت بە پووچەڵ کردنەوەی حوکمی بە سوننەت دانانی ئەم دوو نوێژە بیدعەیە .

تێبینی :

چەند کاتێك هەن مکروهە بەبێ هۆکار نوێژ تیایاندا ئەنجام بدرێ ، ئەم کاتانەش بریتین لەمانەی خوارەوە.

١- دوای نوێژی بەیانی تا بەرزبوونەوەی خۆر بەئەندازەی رمحێك.

٢- کاتی خۆر هەڵاتن تا بەرزبوونەوەی ڕۆژ بەئەندازەی رمحێك.

٣- کاتی گەیشتنی خۆر بەناوەڕاستی ئاسمان . پێش بانگی نیوەڕۆ بەچەند خولەکێك.

٤- کاتی نزیك بوونەوەی خۆرئاوا بوون .

**بەڵگە لەسەر ناتەندروستی نوێژی سوننەت بەبێ هۆکار لە چوارکاتانە ئەم فەرموودانەی خوارەوەن** (عن عقبة بن عامر رضي الله عنه قال: ثلاث ساعات كان رسول الله ﷺ ينهانا أن نُصلِّي فيهن،أو أنْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ موتانا:حين تطلع الشمسُ بازغةً حتى ترتفع، وحين يقوم قائم الظهيرة حتى تميل الشمس، وحين تَضَيَّفُ الشمسُ للغروب حتى تغرب)"

**واتا: عوقبەی کوڕی عامر (ڕەزای خوای گەورەی لێبێت) دەڵێت: سێ کات هەن پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی لێکردووین کەوا نوێژی تیابکەین وە جەنازەی تیادا بینێژین: ئەو کاتەی خۆر هەڵدێت هەتا بەرز دەبێتەوە، وە ئەو کاتەی خۆر گەرم دەبێت و دەگاتە ناوەراستی ئاسمان هەتا لادەدات، وە ئەو کاتەی خۆر نزم دەبێتەوە بۆ ئاوابوونی.**

(وعَمْرُو بْنُ عَبَسَةَ السُّلَمِيُّ: فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ أَخْبِرْنِي عَمَّا عَلَّمَكَ اللهُ وَأَجْهَلُهُ، أَخْبِرْنِي عَنِ الصَّلَاةِ، قَالَ: «صَلِّ صَلَاةَ الصُّبْحِ، ثُمَّ أَقْصِرْ عَنِ الصَّلَاةِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ حَتَّى تَرْتَفِعَ، فَإِنَّهَا تَطْلُعُ حِينَ تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ، وَحِينَئِذٍ يَسْجُدُ لَهَا الْكُفَّارُ،)

**واتا: عەمری کوڕی عەبەسە ووتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە شاری مەدینە ،منیش چوومە شاری مەدینە چوومە لای پێغەمبەری**

خوا (ﷺ) وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵم پێبدە سەبارەت بە نوێژکردن فەرمووی نوێژی بەیانی بکە و پاشان وازلەنوێژ بێنە هەتا ئەو کاتەی خۆر دەردەکەوێت و بەرزدەبێتەوە (بەئەندازەی ڕمحێك) ، خۆر کاتێك دەردەکەوێت لەنێوان دوو قۆچی شەیتان دەردەکەوێت ، وە لەو کاتەدا کافرەکان سوجدە بۆ خۆر دەبەن .

زانایان دەڵێن ئەو نوێژانەی بەهۆی هۆکارێکەوە ئەنجام دەدرێن ئەوە دروستە لەکاتە نەهیەکانیش ئەنجام بدرێن . وەکو نوێژی (تحیە المسجد) ، وە دوو ڕکەعەت دوای تەواوبوونی تەواف لە پشت مەقامی ابراهیم، وە سوننەتی دەست نوێژ، ئەم نوێژانە خاوە هۆکارن بۆیە دروست نیە لەکاتە نەهیەکانیشدا بکرێن ن بەلام ئەو نوێژانەی بەبێ سەبەب ئەنجام دەدرێن دروست نیە لەکاتە نەهیەکاندا ئەنجام بدرێن .

# قصر وجمع

١- ( قصـــر ) واتـا : ( كورت كردنەوەی نوێژە چوار ڕكەعەتیەكان بۆ دوو ڕكەعەت ) .

( جمـــع ) واتـا : ( كۆكردنەوەی نوێژ، بەوەی نوێژی نیوەڕ لەگەڵ نوێژی عسردا ) كۆبكەیتەوە جا چ لەكاتی نیوەڕۆدا بێت واتـا لە پاش نوێژی نیوەڕۆ ڕاسـتەخۆ نوێژی عسـریش بكەی یان لە كـاتـی عسـر دابێت واتـا لـە پێش نوێژی عەسـردا نوێژی نوەڕۆ بكەیت و ئینجا ڕاسـتەوخۆ نوێژی عسـریش بكەیت. بەهەمان شێوە نوێژی مغریب و عیشـاش ( قصر ) واتـا : ( كورت كردنەوەی نوێژە چوار ڕكەعەتیەكان بۆ دوو ڕكەعەت )كورت كردنەوەی نوێژە چـوار ڕكەعەتیەكان بۆ دوو ڕكەعەت تەنها لەكاتی سەفەردا دەبێت ، ئەمەش بەمەرجێك دەبێت كە موسـوڵمان لەسـنووری شـار یان شارۆچكە یان گوندی نیشتەجێ بوونی دەربچـێتـە دەرەوە ، بـەبێ دیاری كردنی ماوە یان ئەندازەی دووركەوتنەوەی لە جێگایە ، چـونكە ئەمە لەسوننەتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دا نـەهـاتووە. كـەواتە ئەوەانەی دەڵێن كورت كردنەوەی نوێژ بەمەرجێك دروسـتە كە ( ٧٠ ) یان ( ٧٣ ) یان ( ٨٠ ) كیلۆمەتر یان ماوەی شـەووڕۆژێك .... یان دووركەویتەوە لە جێگای نیشـتە جێبوونت ئەم وتـانە هیچ بەڵگەیەكی ڕوونی لەسەر نەهاتووە.

خودای گەورە فەرموویەتی ( وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُوا لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا )( النساء ۱۰۱ )

واتا: ئەگەر دەرچوون بەسەر زەویدا بۆ سەفەر ئەوا هیچتان لەسەر نیە کەوا هەندێك لە نوێژەکان – واتا : نیوەڕۆ عسر و عیشا کورت بکەنەوە . عبدالله ی کوڕی ئیمامی عمر فەرموویەتی ( لو خَرجتُ ميلاً قصرتُ الصلاة ) واتا: ئەگەر یەك میل (۱٦۰۳) مەتر بچمە دەرەوە ئەوا نوێژ کورت دەکەمەوە.

إبن القيم فەرموویەتی : ( لَم يُحَدَد (ﷺ) لإمته مسافةً محدودةً للقصرِ والفطر ، بل أطلَقَ لهُم ذلكَ في مطلق السفر والضرب في الارض ).

واتا: پێغەمبەر(ﷺ) ئەندازەیەکی دیاری نەکردووە بۆ ئۆممەتەکەی بۆ کورت کردنەوەی نوێژ و ڕۆژی نەگرتن بەڵکو ئەمەی بەڕەهایی هێشتۆتەوە بۆ هەر سەفەرێك بێت یان هەر دەرچوونێك بێت بەسر زەویدا.

وقالَ الصنعاني : ( وجواز القصر والجمع في طويل السفر وقصيره ، مذهب كثير من السلف ) .

واتا: دروستیەتی کورت کردنەوەی نوێژ و کۆکردنەوەی بۆ سەفەری درێژ و کورتیش بۆچونی زۆرینەی سەلەفە .

زانایانی شەرع کەتوونەتە رای جیاوە دەربارەی ئەو مەسافەیەی کە دەبێتە هۆکاری کورت کردنەوەی نوێژ و زۆریان مشتومر لەسەر هەیە .تەنانەت ئبنو لمونزیر و کەسانی تریش لەم مەسەلەیدا بیست جۆر رەئیان گێراودتەوە. راسترین را و صەریحترین فەرموودە کەلەم بارەیەوە هاتبێت وەکو ئبینولحەجەر لە فەتحولباری – ج /٢ / ٥٦٢ – دەلێت : ئەو فەرموودەیە کە موسلیم و ابو داود لە حەدیسی ئەنەسدا ریوایەتیان کردووە، کە تێیدا هاتووە دەفەرموێ :

پێغەمبەری خوا کەسەفەری بکردایە سێ میل ، یان سێ فرسەخ لەماڵ دوور بکەوتایەوە نوێژی کورت دەکردەوە لە جیاتی چوار رکەت دوو رکاتی بەجێ دەهێنا ) .

عن علي بن ربيعة قال: ( خرجنا مع علي بن أبي طالب رضي الله عنهُ متوجهين ههنا _ وأشارة بيده إلى الشام _ فصلى ركعتين ركعتين حتى إذا رجعنا وانظرنا إلى الكوفة حضرت الصلاة فقالوا : ياأمير المؤمنين هذهِ الكوفة تتم الصلاة؟ قال لا حتى ندخلنا ) رواه حاكم والبيهقي ).

واتا: لەگەڵ علی کوڕی أبی تاڵب دا ( خودا لێی ڕازی بێت ) دەچووینە دەرەوە و ڕوومان کرد لەشام جا دوو ڕکەعەت دوو ڕکەعەت نوێژی دەکرد تاوەکو گەڕاینەوە و سەیری کوفەمان کرد وبینیمان لەوکاتەدا کاتی نوێژ ئامادە بوو ، ووترا: ئەی فەرمان ڕەوای ئیمانداران ئەمە کوفەیە ئایا نوێژەکە بەتەواوی بەچوار ڕکەعەت ناکەیت ؟ فەرمووی نەخێر بەردەوام نوێژەکەمان کوورت دەکەینەوە تاوەکو دەڕۆینە ژوورەوە .

قال الحافظ ( المراد بقولهم : "هذهِ الكوفة" أي : فأتم الصلاة ، فقال: "لا حتى ندخلها" أي لانزال نقصر حتى ندخلها فإنا مالم ندخلها في حكم المسافرين )

واتا: مەبەست بەو ووتەی " ئەمە کوفەیە؟ واتا نوێژەکە تەواو بکە فەرمووی: نەخێر بەردەوام نوێژەکەمان کورت دەکەینەوە تاوەکو دەڕۆینە ژوورەوە ،چونکە تاوەکو نەڕۆینە ژوورەوە هەر لەحوکمی موسافر داین.

## -ماوەی کورت کردنەوەی نوێژ

ئایا تا ماوەی چەند ڕۆژ موسافر دەتوانێت نوێژەکان کورت بکاتەوە؟ هەروەها لێرەشدا بەهەمان شێوە لەسوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) هیچ ماوەیەك دیاری نەکراوەبۆنەوەی موسافر نوێژەکانی تێداکورت بکاتەوە و ئینجا دوای ئەوە بەتەواوی چوار چوار بیانکات ئەگەرچی لەسەفەریشدا بێت بەڵکو بەردەوام نوێژە چوارییەکان کورت دەکاتەوە تاوەکو دەگەڕێتەوە بۆ جێگای نیشتەجێ بوونی خۆی ئەگەرچی چەندین ڕۆژ یان مانگ یان ساڵ بمێنێتەوە ئەوا هەرنوێژەکانی کورت دەکاتەوە مادام لەسەفەردایە .

قال إبن عمر ( إنَّ رسول الله (ﷺ) كانَ إذا خَرَجَ مِن أهلهِ صلّي ركعتين حتى يَرجع إليهم ) رواه أحمد )

واتا : پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەرلەنێوکەس وکاریدادەربچوویایە ئەوا دوورکەعەت نوێژی دەکرد تاوەکو دەگەڕایەوە کەواتە ئەوانەی دەڵێن : کورت کردنەوەی نوێژ ئەوەندە دروستە کەبۆماوەی ( ٤ ) ڕۆژ یان ( ١٠ ) ڕۆژ یان ( ١٥ ) یان ( ١٧ ) یان ( ١٩ ) یان ( ٢٠ ) بمێنیتەوە لەسەفەردا ئینجا دوای ئەم ماوەیە دەبێت نوێژە چوارییەکان بەتەواوی چوار چوار بکات ئەگەرچی لەسەفەریش دا بێت . ئەم ووتانە هیچ بەڵگەیەکی ڕوونی لەسەرنەهاتووە . بەڵگەی خاوەنی ئەم وتانە بریتیە لەوەی کە دەڵێن : پێغەمبەر (ﷺ) لەسەفەرەکانی دا ( ٤ ) ڕۆژ یان ( ١٠ ) یان ( ١٥ )یان ( ١٧ ) یان ( ١٩ ) یان ( ٢٠ ) ماوەتەوە

و نوێژەکانی تێداکورت کردیتەوە بۆیە دەبێت هەرئەوەندە نوێژەکانمان کورت بکەینەوە وەلامی زانایان بۆئەم ووتەیە ئەوەیە کەدەڵێن : ڕاستە پێغەمبەر(ﷺ ) لەسەفەرەکانی دا جاری وا هەبووە ، (٤) ڕۆژ یان (١٠) یان (١٥) یان (١٧) یان (١٩) یان (٢٠) ماوەتەوە ،چونکە لەسەفەرەکانی دا هەرئەوەندە ماوەتەوە بەپێی پێویستی کات بۆ ئەنجامدانی کارەکانی و پاشان گەڕاوەتەوە ،ئەمەش نابێتە ڕێگر لەوەی کەوا ئەگەر کەسێك لەسەفەرەکەیدا زیاتر لەوماوانە مایەوە ئەوا ئیتر نابێت نوێژەکانی کورت بکاتەوە ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم تێگەیشتنەی باس نەکردووە و ئاماژەشی بۆنەکردوە . هەورەوەها بۆمان هەیەبلێین :بەلگەتان چیە ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ ) لەسەفەرەکانی دا لەوماوانە زیاتر بمایاتەوە ئەوا نوێژەکانی کورت نەدەکردەوە ؟ لەڕاستی دا هیچ بەلگەیەکیان بەدەستەوە نیە . بۆیە موسافر تاوەکو لەسەفەردایە ئەوا پێویستە نوێژەچواریەکانی کورت بکاتەوە تاوەکو دەگەڕێتەوە هەرچەند بمێنێتەوە.

٢- ***جمع الصلاة*** : ( واتا کۆکردنەوەی نوێژ. بەوەی نوێژی نیوەڕۆ لەگەڵ نوێژی عەسردا ) کۆدەکەینەوە جا چ لەکاتی نیوەڕۆدا بێت واتا لەدوای نوێژی نیوەڕۆ ڕاستەوخۆ نوێژی عەسریش بکەیت ، یان لەکاتی عەسردابێت واتا لە پێش نوێژی عەسردا نوێژی نیوەڕۆ

بکەیت ئینجا ڕاستەوخۆ نوێژی عەسریش بکەیت. بەهەمان شێوە نوێژی مەغریب و عیشاش.

## -لەچ حالەتێکدا نوێژە فەرزەکان کۆدەکەینەوە ؟؟

ئەگەر کەسێك نیازی سەفەرکردنی هەبوولە پێش نیوەڕۆ ئەوانوێژی نیوەڕۆدا ئەوا نوێژی نیوەڕۆ دوادەخات بۆلای نوێژی لای نوێژی عەسر ئینجا لەکاتی عەسردا هەردووکیان کۆدەکاتەوە دوو ڕکەعەت نوێژی نیوەڕۆ دەکات پاشان دوو ڕکەعەت عەسر. ئەگەر کەسێك نیازی سەفەرکردنی هەبوولە پاش نیوەڕۆ ئەوا چوار ڕکەعەت نوێژی نیوەڕۆ لەکاتی خویدا دەکات ئینجا ڕاستەوخۆ لەدوای نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکەعەت نوێژی عەسریش دەکات و هەردووکیان کۆدەکاتەوە بەبێ کورت کردنەوە چونکە هێشتا سەفەری نەکردووە. وە ئەگەر کەسێك نیازی سەفەرکردنی هەبوولە پێش مەغریب ئەوا نوێژی مەغریب دوا دەخات بۆلای نوێژی عیشا ئینجا لەکاتی عیشادا هەردووکیان کۆدەکاتەوە. سێ ڕکەعەت نوێژی مەغریب دەکات پاشان دوو ڕکەعەت نوێژی عیشا. ئەگەر کەسێك نیازی سەفەرکردنی هەبوولە پاش مەغریب ئەوا نوێژی مەغریب دەکات لەکاتی خۆیدا ئینجا ڕاستەوخۆ چوار ڕکەعەت نوێژی عیشا دەکات. هەردووکیان کۆدەکاتەوە بەبێ کوورت کردنەوە چونکە هێشتا سەفەری نەکردووە. وەئەگەرلەسەفەردابوو ئەوا پێویستە نوێژە

چــوارییەکان کورت بکاتەوە بۆ دوو ڕکەعەت ،بەلام بۆکۆکردنەوەیان ئـەوا دەتوانین نویـژی نیوەڕۆ دوا بخـات بۆلای عـەسـریان نوێژی عەســر پێش بخات بۆلای نیوەڕۆ .هەروەها دەتوانین نوێژی مەغریب دوا بخات بۆلای عیشا یان نوێژی عیشا پێش بخات بۆلای مەغریب .

( أنَّ رسولَ اللهِ - ﷺ -كان في غزوةِ تبوكَ " إذا زاغتِ الشمسُ قبلَ أن يَرتحلَ " جمع بينَ الظهرِ والعصـرِ،وإن تَرَحَّلَ قبلَ أن تزيغَ الشـمسُ أخر الظهرَحتى ينزلَ للعصـرِ، وفي المغربِ مثلَ ذلـك " إن غـابتِ الشمسُ قبلَ أن يرتحلَ " جمع بينَ المغربِ والعشاءِ، وإن ارتحل قبل أن تغيبَ الشـمسُ أخر المغربَ حتى ينزلَ للعِشـاءِ، ثم جمع بينهمـا ) ( صحيح أبي داود )

واتــا : پێغـەمبەر( ﷺ ) لەغەزای تەبووك ئەگەرخۆرلەناوەڕاســتی ئـاسمـانـدا لاییـدایە پێش ئەوەی دەربچــوایە ئەوا نوێژی نیوەڕۆ وعـەســری کۆدەکردەوە ، ئـەگەرپێش خۆرلەناوەڕاســتی ئاسماندا لاییـدایە پێش ئەوەی دەربچــوایە ئەوانوێژی نیوەڕۆی دوادەخســت تـاوەکو دادەبەزی بۆنوێژی عەسـر ،لەمەغرییشـدا بەهەمان شێوە. ئەگەرخۆرئاوا بوایە پێش ئەوەی دەربچــوایە ئەوا نوێژی مەغریب و عیشــای کۆدەکردەوە ،وەئەگەر پێش خۆرئـاوابوون دەربچــوایە ئەوا نوێژی مەغریبی دوادەخست تـاوەکو بۆنوێژی عیشا دادەبەزی.

## چەند تێبینیەک :-

**یەکەم :** کورت کردنەوەی نوێژە چوارییەکان لەسەفەردا واجبە دەبێت دوو ڕکەعەت دوو ڕکەعەت ئەنجامیان بدات جا چ بەڕێوەبێت و لەسەفەربێت یان جێگیربوبێت لەسەفەرەکەیدا .

بەلام کۆکردنەوەی نوێژەکان بە پێی پێویست ئەنجام دەدات و نابێت بەردەوام نوێژەکان کۆبکاتەوە بەبیانوی ئەوەی لەسەفەردایە .

کەواتە ئەگەر موسافر پێویستی بەکۆکردنەوە هەبوو ئەوا نوێژەکان کۆدەکاتەوە . جا چ ئەمە بۆ بەڕێوەبوون بێت لەکاتی یەکەمینیان دا یان دووەمینیان دا بێت لەحاڵێکدا کە دابەزین و جێگیربوونی دا بێت لەبەر پێویستیەکی تر ،بونموونە : ئەگەر پێویستی هەبوو بۆخەوتن و پشوودان لەکاتی نیوەڕۆدا دادەبەزێت کە ئەوماندووە و خەوی دێت برسیەتی و پێویستی بە پشوودان و خواردن و خەوتن هەیە .

لەم حاڵەتە دا نوێژی نیوەڕۆ دوا دەخات بۆلای کاتی عەسر، ئەنجا پێویستی هەیە بەوەی کە نوێژی عیشا پێش بخات و لوگەڵ مەغریبیدا کۆیبکاتەوەو ئەنجا دوای ئەوە پشوو بدات و بخەوێت .

بەلاَم ئەگەر کەسێك چەند ڕۆژێك لەگوندێکدا یان لە شارێکدا بمێنێتەوە و جێگیر بێت بۆ ماوەیەك ئەوا ئەم کەسە هەرچەندە نوێژەکانی کورت دەکاتەوە بەلاَم نابێت کۆیان بکاتەوە ئیلا مەگەر لەبەر پیویستی یەك نەبێت . بڕوانە کتێبی (سلسلة الاحادیث الصحیحة ) للشیخ الالبانی (٣١١/ ٣١٥ ) بەلاَم نوێژی بەیانیان ئەوا لەگەڵ هیچ نوێژیکدا کۆناکرێتەوە ، بەڵکو دەبێت تەنها لەکاتی خۆیدا بکرێت .

***دووەم*** : کۆکردنەوەی بەهۆی باران بارینەوە یان قوڕەلیتەوە یان ڕەشەبای ساردەوە .

***سێ یەم*** : کۆکردنەوەی نوێژ بەهۆی ترسەوە لەحاڵەتێکی نائاسایدا .

***چوارەم*** : کۆکرنەوەی نوێژ بەبێ هۆکارێکی نائاسایی بەڵکو بۆ دوورخستنەوەی ناڕەحەتی لەسەر موسڵمان .(عن ابن عباس قال (جَمَعَ رسول اللة صلى اللة عليهِ وَسَلَم بين الظُهرِ والعَصرِ والمغرب والعشاءبالمدينة من غير خَوف ولا مَطَرِ ولا سفر،فقيل لإبن عباس: ماأراد إلى ذلك ؟ قال :ماأراد أن لا يمدج أمتهِ ) (متفق عليه )

واتا : پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی نیوەڕۆو عەسر، وە مەغریب و عیشای کۆدەکردەوە لەناومەدینەدا بەبێ ترس و بەبێ باران و بەبێ سەفەر

**وترا بە أبی عباس مەبەستی چی بووە ؟ فەرمووی :مەبەستی ئەمەبوو .ئەم فەرموودەیە چەند سودێکی تێدایە لەوانە :**

- **کۆکردنەوەی نوێژەکان بەهۆی ترسەوە کارێکی شەرعیە .**
- **کۆکردنەوەی نوێژەکان بەهۆی بارانبارینەوە کارێکی شەرعیە .**
- **کۆکردنەوەی نوێژەکان بەهەر هۆیەکەوە کەببێتە مایەی نارەحەتی لە ئەنجامدانیدا لەکاتی خۆیاندا وەکو: نەخۆشی یان ماندووبوونێکی زۆر ............ یان... هتد**

( وصلی اللہ علیه وعلی آله وصحبه أجمعین)

داوای لێبوردن لە خوێنەرانی ئـازیز دەکەم لە هەر کەم و کوڕییەك ئەگەر هەبێت ، کەمال و گەورەیی تەنها بۆ خوای گەورەو میهرەبانە...

﴿لە دوعاو نزاکانتان بێ بەشم مەکەن انشاء الله﴾

